دیوانی تازه

زنجیرەی ژمارە - ٣



# سروشت و دەروون



لەگەڵ ئۆبەرێتی ئەنجامی یاران

گۆران

ساڵی ١٩٦٨

چاپخانەی کامەران سلێمانی

دیوانی تازه

زنجیرەی ژمارە ٣

# سروشت و دەروون

لەگەڵ ئۆپەرێتی ئەنجامی یاران

گۆران

ساڵی ١٩٦٨



چاپخانەی کامەران ـ سلێمانی ـ ت ٦٠٨

# پێشکەشە بۆ :

خاوەنی ئەو دەروونە ڕووناکانە کە دەرسی پێشکەوتن
لە سروشتی جوان وەرئەگرن ، بۆ گیانی ڕابەرەکانو سەربازە
ئەبەزەکانی ڕابەرین ! چی مردوو چی زیندەو چی
هێشتا نەزاو . . .

گۆران

# سەرەتایەکی کورت

خوێندەواری بەڕێز :

شیعری ( گۆران ) وەکو چیایەکی هێجگار بڵندو قەشەنگ وایە لەناو ڕیزە چیاکانی شیعرو ئەدەبی کوردیا ، لە هەموو شوێنێکی دوورو نزیکەوە لوتکەی بەرزو دڵگیری ئاسۆی پێش چاو ئەڕازێنێتەوە . هەر چەندە چەوتیو ئەرکی ژیانی تایبەتی ( گۆران ) وەکو ئادەمیزادێك لەگەڵ تەنگو چەڵەمەی کۆمەڵو نیشتمانەکەیا دووری خستۆتەوە لە دنیای نوسینو شیعر گەلێك جار بەڵام لەگەڵ ئەوەشا ( گۆران ) بەرهەمێکی زۆرو بێ هاوتای ئامادە کردوە

بەلای منەوە ( گۆران ) مامۆستایەکی گەورەو هونەرمەندێکی بێهاوتای کوردەوارییە کە نهێنیەکانی ئێستاش بە تەواوی نەکەوتۆتە بەر چاوی دنیای پێشکەوتوو .

لە پێش سەد ساڵ زیاتر دا شاعیرێکی گەورەی ئینگلیزی کە ناوی ( شیللی ) یە شیعری ( To The Skylark ) ی داناوە ، لە پێش شەڕی جیهانی دووەم دا ( گۆران ) ئەو شیعرەی خوێندۆتەوە وەالهامی لێوەرگرتوە بۆ شیعرێکی تازە بەزمانی کوردی ، سەرەتای شیعرەکەی گۆران ئەمەیە کە هەموو بیستومانەو خوێندومانەتەوە : ـ

ئەی بلبلی ئێسك سووك !

باڵداری دەنووك بچوك !

ئێستا من دیوانی شیعرەکانی ( شیللی ) م لەلایە ، بەراوردی ئەو

شیعرەی شیللی ئەکەم لەگەڵ شیعرە کوردیەکەی گۆرانا ئەبینم هونـــەری شیعرەکەی گۆران سەرکەوتوو ترە ، ووشەکانی ساکار ترو پرر مانا تر ، وە مۆسیقاو ئاوازی شیعرەکەی گۆران شتێکی ترە ! .

ئەمە یەکەم جار نیە کە من ئەم چەشنە بەراوردە ئەکەم نازانم چی نهێنیەکە کە شیعری ( گۆران ) ی ڕازاندۆتەوە بەم شێوەیە ؟ . جاری وا هەیە ئەڵێم خۆزگە هەروەکو چۆن ئێمە کوردی ئەزانین ئەدیبو هونەرمەندەکانی وولاتانیش کوردیان بزانیایە وە ئەم شیعرانەیان بەراورد بکردایە لـــەگەڵ شیعری ترا ، وەکو بیستومە هەندێکیان لە ئینگلترە وەلە یەکیەتی سوڤیات ئەم کارەیان کردوە ، تەنانەت ڕۆژهەڵات ناسێکی سوڤیاتی بڕیاری ئەوەی داوە کە ( گۆران ) گەورەترین شاعیری ئەم چەرخەیە لە ڕۆژهەلات دا ، بەلای منەوە سەیر نیە کە ڕۆژێك ببیەم ڕۆژهەڵات ناسێکی انگلیزیش هەر بـــەم چەشنە بڕیارێك بدات وە ڕۆژئاوای دنیاشی بخاتە پاڵ . !

لە چاپ کردنی ئەم شیعرانەدا یارمەتیم بەزۆر چەشن لەم برایانـــە وەرگرتوە سوپاسیان ئەکەم : ـ ماموستا ( محمد حسین برزنجی ) ، ماموستا ( صالح یوسفی ) ، ماموستا ( عبدالله محمد امین ) ، مامۆستا ( ساجد ئاوارە ) ، ماموستا ( جلال مرزا کریم ) ، ماموستا ( بابا علی برزنجی ) وە کاك خضر رضا . هەروەها سوپاسی کاربەدەستانی ڕۆشن بیر ئەکەم لـە وەزارەتی ثقافەو ارشاد وە ئێستگەی کوردیو لیوای سلیمانی چونکە ڕێگایان داوە لە چاپ بکرێت .

هۆکر گۆران

# دار چوالەی پشکوتو

ـ لە گەڕانەوەدا بەچەمی قلیاسانا ـ

لە پاش بڕینی ماوەیەکی دوور ،
گیانی وەڕسی ڕێگای سەرەو ژوور ،

دی : پاس کشایە ناو پێچێکی لێژ ،
لای چەپ چناری باریك و درێژ . .

ڕەپ ڕاوەستابون لە کەناری ڕێ ،
سەربازی پاس بوون بۆ پشت سەری کێ ؟

ڕیزێك ئەمامی دار چوالەی نازدار ،
کە ڕێك وەستابوون لەسەر گیای بەهار . .

وەك بووك ئەندامیان لە سوراو نابو ،
لەنجەی ناو ئاویان بۆ چەپەی با بو ! .

بەرەی هەڵاڵەی چوالەی سوراو ڕەنگ ،
جار جار ئەوەری بەخشەی بێ‌ی هەنگ ،

هەروەك پەپولەی باڵ فرە فڕ کەر
ئەنیشتنە سەر یەك لەسەر گیای سێبەر

لەگەڵ لێشاوی پەڕەی گوڵ بارین
یا بۆ شەپۆلی ( بۆن خۆشی ) چین چین

چەمی تانجەرۆی سەردەمی نیسان
پڕە لە وێنەی سروشتی جوان جوان

بەلام من چاوم گێڕا خوارو ژوور
لە ڕیزە داری چوالەی تارا سوور

جوانترم نەدی وەك بووك وەستا بێ
سەیرانگای چەمی وا پێ ئاوا بێ



# بەهاری پاش باران

وشکە چەم وەك جەوری سەردەم . هەلساوە ،
بەرگی سەوز و نەرمی بەهار ژاکاوە ،

هەر هێلی گاسنی وەردی کێلراوە ،
هەتا چاو بڕ ئەکا جۆگەلەی ئاوە ا .

جوتیاری نەقیزەی درێژ سەرشان نەڕ ،
بەرەو مال لەقەلەق گای داوەتە بەر ،

تا ئەژنۆ لە قوڕدا و کەپەنەك لەسەر ،
بۆ ڕانی تەریبوی هەلپەو خەم لەبەر ،

مامەی شوان وەك خۆی بەرخی باوەشی ،
تەڕ تەڕەو هەلئەستێ هەلم لە لەشی ،

کچانی کۆلە گیای کوڵاندن بە کۆل . .
بەرەو دێ ڕەویون وەك مامزی چۆل ،

لە ئاو هەلکشاوە پەلو پۆی بالدار . .
ڕەنج ئەدا فرە فڕ نا گاتە سەردار ،

تەڵانی ناو باخی پڕ فەرشی گیای سەوز ،
(لێڵاو)ی بارانـاو کردویە بـە حەوز ،

لە لێواری حەوزا گوڵاڵە و بەیبوون ،
سـاوان و ئەلەرزن لەتاو نوقوم بون ،

درەختی هەڵـوژەی بـەفر داپۆشـیو ،
دارسـێوی ڕازاوە بـە پۆپلانـەی زیو ،

هەڵاڵەی وەراندون تەووژمی باران .
وەك بووکی ڕوت کراو کەوتونە گریان . .

لەبەر پێی نەمامی چوالە دا ســوراو ،
لە ڕومەت تکاوە و ڕژاوەتە ئاو ،

گوڵباخی کەشـاوەی کەڵا تێك شـکاو ،
بـە کولمیا دێتە خوار ئارەق لـە گوڵاو ،

وەك یاری شـەرمنی دەس لە مل ئاڵاو ،
بەگوپچڕ دەربازبووی شـانەو قژ شـێواو ، !

ئـەمەیـە دیمەنی پاش وەشتی نیسان :
بۆ شێلی سەتەمە گشت شتێکی جوان !

تا هەوری ڕوی ئاسمان دڕ ئەداو هەتاو
ئارامی شیرین تر ئەخاتـــەوە ناو . .



# پایــــز

پایز ! پایز !
بووکی پرچ زەرد . .
من مات ، تۆ زیز !
هەردوو هاو دەرد . .

من فرمێسکم ، تۆ بارانت !
من هەناسەم ، تۆ بای ساردت !
من خەم ، تۆ هەوری گریانت !
دوایی نایە : دادم دادت !
هەرگیز هەرگیز !
پایز ! پایز ! . .

پایز ، پایز !
شان و مل ڕووت !
من مات تۆ زیز
هەردوکمان جووت . .

هەر چەن گوڵ سیس ئەبێ بگرین ،

ئاڵتونی دار ئەرژێ بگرین ،
پۆلی باڵدار ئەفڕێ بگرین . .
بگرین ، بگرین ، چاومان ئەسڕین
هەرگیز ، هەرگیز ،
پایز ! پایز !



# هەوری پایـــز

لە دەریاوە قەناری هەوری با ڕشت کەوتە دوی پێشەنگ
بەسەر سنگی چیادا چۆکی دا داوە کشوو بێ دەنگ

بەسەر پایزی زەردا با بە خوڕ بگری ، بە کوڵ بگری !
لەســـەر ئاخر گەڵا ، ئاخر چڵی تەنیایی کوڵ بگری !

بەخوڕ بگری ! بە کوڵ بگری ! بەسەر دەشتو دەری وشکا !
بەسەر داری گەڵا زەردا ! بەسەر پووشا بەسەر دڕکا !

بەسەر سەرچاوەیی کزرا ! بەسەر زیخی چەمی دێما !
بەسەر هەر وشکیەکا وا لە هاوینی گەرم جێ ما !

بەلێ بگری ! بەکوڵ بگری ! هەتا ئاخر دڵۆپ بگری !
بە گریەی هەوری پایز با نقوم بێ سینەیی کزری !

بەفر ئاسۆی بڵند بگرێتە چوار چێوەی بلوریی !
لە چەم هەڵسێ خوڕەو هاژەی شەپۆلی ئاوی خوێنیی !

دڵۆپی ساردو. فێنك با لەسەر دارو دەوەن بڕژێ ،
بەپولەی زەردی ئاڵتونی لەسەر لق هەڵوەرێ بپژێ ،

بەڵێ بگری ! هەور ، بارانی پایز ، بێ وچان بگری !
لەسەر باغچەی گوڵێ واسیس ئەیێ ئاخر چلی عومرێ !

بگرمێنێ ! تەپ و نم دا بکا بێ کاتە شەست هەرگیز !
نەوەستێ قوڵپی گریانێ ، نەوەستێ هەورەکەی پایز !

تەبیعەت زەردو ژاکاوە لە حالی گیان کەنشتایە ،
نیشانەی ماتەمی پایز لە فرمێسکی درشتایە ! ! .



# سەوزەگیای پایز

بۆ گیانی بەرزی ( مەولەوی )

گیا وردە پایز ! سەوزی نەرمو نۆڵ !
قەیفە پۆشی ڕوی تەختی خاك و خۆڵ !

دلگیری ، جوانی ، بێ دڕك و داڵی !
دوا یادگاری بەدیعی ساڵی !

هەچ ئێوارەیەك دیدەنیت ئەكەم ،
سەمای پایزم تیا نامێنێ تەم . .

مەستی بادەی حەز پرر نەشئە و خەیاڵ ،
ئەسوڕێمەوە لەم یاڵ بۆ ئەو یاڵ ،

ئەنجا دێم لەسەر سینەی نەرم و شل ،
ڕا ئەكشێم تاوێك نوقمی تأمل :

تاوێك نەغمەی مەل ، تاوێك شنەی با ،
تا ئەودیو شاخی ئەندێشەم ئەبا . .

خۆم بە خۆم ئەڵێم یاران من چیم کرد ؟
بۆچ عومری جوانیم وەك پیر بەسەر برد ؟

منیش لە دایکی تەبیعەت زاوم ،
بۆچ کردەوەی ئەو نابینێ چاوم ؟

هەروا بەسەر چو خەزانی پیریش ،
کەچی ئەو زیاتر ئەکا ئارایش ؟ !

تازە سەوزە گیا سەر لە نوێ ئەڕوێ ،
مەل لە ماجەرای عەیشو نۆش ئەدوێ . .

تازە سروەی بای قودسی ( عیسافو ) ،
گیان ئەکاتەوە بەر دنیای مردو . .

ئەی گیا سەوزەکەی دڵ فەرەحاوی ،
وەك تۆ سەر گەرمی سەودای هەتاوی !

منیش لەمەو پاش وایە بڕیارم :
تیژکی خۆر بێ لام نازخەندەی یارم ،

تا گەرمابێ ژین ماوە شادی کەم .
تیتر واز بێنم لە ناشنایێ خەم ! . .

# دیمەنیکی بەهار

ئەملا یەك پەڵە ، ئەولا یەك پەڵە ، هەوری ڕەنگاو ڕەنگ ،
لە ناوەڕاستا بە دەم ئاسۆوە ، ڕۆژی شۆخ و شەنگ ! .

سەوزە گیا پاراو گوڵ و گوڵاڵە مەستی ڕەنگ و بۆ ،
درەخت تازە شین ! سەرلق ڕازاوەی گوڵ ، گەڵا ، چرۆ ،

سەرتاپای چیمەن دەرژەدا چین چین ، مرواری ئاونگ ،
چەشنی تارای سەوز ، ئەدرەوشێتەوە لێی ئەتکێ پرشنگ ،

نەسیمی بۆن خۆش کزەبای فێنك وەك نەوای ئیلهام ،
سەمای جوانی بەری تەبیعەت دێنێتە ئەنجام . .

قاسپە قاسپی کەو نەغمەی چۆلەکەو بلبلی دەنگ خۆش ،
پیاڵەی نەشئە ، حتی بە ڕۆحی بەردیش ئەکا نۆش ،

وەك بگری بە کوڵ دنیای سەرمەستی قاقای پێکەنین ،
لە هەمو عاشقێ فرمێسکی کانیی گەرمیی هەڵقوڵین . .

مەلی سەر بنچك ! پەلو بۆ ڕەنگین خۆ من هەڵۆ نیم !
لێم مەفڕن جوت جوت ، مەترسن ئاخر ! پێتان بڵێم چیم ؟

منیش وەك ئێوە لـــە دنیای گەورە گەردێکم بچوك !
هەتا ناشـــتوانم بفڕم ، بخوێنم ، بە باڵ ، بە دەنووك !

بەڵام وەك ئێوە، لە دڵما ئەگرێت ، مەیلی سەربەســـتی ،
ئەمەش ، ئایینم وەك ئاینتانـە ! هەردە پـەرســـتی !



# تاریکە شەوێ

تاریکە شەوێ نوقمی ڕەشی چەهرەیێ دنیا ،
دیلی تەمی ئەسرار بو دەرو دەشتی حقایق .
چوبونە پەنا پەردەیی خەو کەون و خەلایق .
مستغرقی ئەندێشـە ئەبوو سـاهری تەنیا . .

* * *

تاریکی ،، تەمی دەشتی دڵ و تانەیی سەرچاو ،
شاباڵی پەخش کرد بو تاکو ئەبەدیەت .
بێ دەنگی لە چوار لاوە مهاجم وەخرۆشاو .
وەك زوڵمەتی شەو نەی بو ئەویش نوك‌و نهایەت

* * *

جار جار لە ئوفق ڕائەوەشا شیری بروسکە ،
گرمەی غەزەلی گوێ‌ی کەڕ ئەکرد هەورە تریشقە .
باران سەرەتای ڕقی بو ! نم نم ئەگریا ،
وەستا بو زەوی تینو زەلیلانە لە بەریا . .

* * *

ئەمجا بەخوڕەم باری لەپاش یەك دوو دەقیقە ،
ئافاقی ئەمەل ڕەش بو ، نەما پێوە بروسکە ،

تاو تاو لێی ئەدا تەپڵی هجوم ئەرزە بەناهەنگ ،
وەختێ کە ئەهات حەملەیی با تونگ‌و خرۆشان ،
ئەی ڕشتە دڵی پیاوی جەسوور کەڵکەڵەیی جەنگ ،
هەر وەك دڵی خەوانی ئەترسان‌و ئەلەرزان ! . .

* * *

لەم حاڵەتەدا ڕۆحم وەکو چاوی گـلاوی :
ئانێکی بەقەد سالێ پیری زەهری ئەلەم بو ،
ناگا ، هەمیسان نیشتەوە لافاوی تەبیعەت ،
تا هێستە ئەما زەلزەلەو ئەعرەیی حدەت ،
کەوتە تەنکی هەوری ڕەش‌و چلکنی پێشوو ،
ئەلواني قەزەح تێکەڵی بو ، کون چوە ناوی !

* * *

ئەستێرەیەکی جوانی گەشی پرر لە تەبەسم ،
دەرکەوت و گەشا لێوە بەدڵ زەوقی تەماشا ،
بەحری هەوەس و شەوقم وەها هاتە تلاطم . .
بۆ سەیری جمالی کردنی دنیای بەیاني ،
هێشتا شەوی زۆر مابو کە من کەوتمە سەحرا .
وەك شێت ، بەلام شێتی شعر شێتی جواني !



# ئــەی گەلاویژ

بەشەو گەشتی و گوزاری خاطرات هەر وەك شنەی شەوبا
لــە ڕۆحی پڕ تأثرما ئەکا سەهرەی خەفەت بەرپا . .

ئەلێی بەحرێکی قوڵو مەنگە دنیای پڕ لــە بێ دەنگی :
بەسەریا هاژە هاژ ئــەڕژێ ئەبینم سۆزی ئاهەنگی ،

هەتا سەر ڕوی زەوی چین چین ، نەویوە پەردەیی تاری ،
لە خوێنشــم دیار نیە وێنەی دڵوپی ئەشکی بێداری ،

دڵم واگیر ئــەدا گەرداوی باس و نائومێدی ڕەش ،
مەگەر تۆ بێتە امدادم گەلاوێژ ! ئەی ستارەی گەش !

مەگەر تۆ ئەی گەلاوێژ ! ئەی بزەی لێوی سەحەر گاهان !
مەگەر تۆ بســرەوێنی قوڵپی ئێشی قەلبی بێ سامان !

لە چاوی تۆوە پرشنگێ ئـەگاتـە ڕۆحی بەدبەختم !
ئەکا مەستی تەسەلی تا شەوی دوایی ، سەری ســەختم !

دەسا ئەی شا ستارە ! ئەی گەلاوێژی گەشو تابان !
کە هەڵهاتی بە ئەگریجەت بشــۆ چاوی شــەوی گریان !

# بەسەرهاتی ئەستیرەیەك

بانگی شێوان لە ئاسمانی خۆرنشین . .
ئەستێرەیەك ئەجربوێنێ گەش ، شیرین ،

دەورو پشتی دەریای شینە و بە تەنیا ،
سەرنج ئەدا لە ئێوارەی ڕووی دنیا . .

لە پرشنگیا هەیە شێوەی چاوی کاڵ ،
لە لەرزینیا زەردەخەنەی لێوی ئاڵ ،

وەك ئەو گوڵەی ئەیدا لەسەر نازدارێ ،
تێر نابێ لێی ، هەر چارێ بۆی ئەنوارێ . .

منیش یەکێ لەو تەماشاکەرانەم ،
دڵگیرۆدەی ئەم جوانیی ئێوارانەم . .

لەسەر گردێ بەرامبەری ئەوەستم ،
کەیلی بزەی ئەبێ سەرنجی مەستم . .

تاریك دایەت ئەستێرەی تر بەرەو دوا ،
فرێ ئەدەن چارشێو لە عاستی دنیا . . .

بەڵام ئێستا ئەو ئەسپایی بەرەو خوار ،
هەڵئەخلیسکێ ، کز کز ، ئەگاتە لێوار ،

لێوی تینوی گەل وەك دڵۆپ ئەیمژێ :
ئەی داخەکەم مەرگی نیشتن ئەی کوژێ ،

ئەم ئەستێرە بەسەرهاتی دڵگیرێ ،
لە کام ڕۆحا نابزوێنێ زویرێ ؟



# بو گولی لاولاو (١)

بەکوڵ گریان لە چاوم دێ گوڵی لاولاوی ڕەنگاو ڕەنگ
لەبەر چی سیس ئەبی وا زو ؟ چیە ئەسبابی ژاکانت ؟
هەمو تاوێکە رۆژ هەڵهاتوە ، بۆچی وەها بێ دەنگ ،
ئەژاکێی ؟ تو خوا ئەی گوڵ ، سەبر دەستم بەدامانت !

° ° °

سەبر تووبی خوا ، تاوێکی تر ڕاوەستە ! تا هومرم :
وەکو ڕۆژی چلەی زستان ، لە هەوری مەینەت ئاوابێ !
منیش هاورێی سەفەرتم ئەی گوڵی لاولاو ! منیش ئەمرم !
منیش خیلقەت وەکو تۆ ، وا نەبێ زۆرم لەگەڵ چابێ !

° ° °

منیش وەك تۆ بەقام کورتەو بەهارم تیژو کەم فرسەت !
کەشەم مەیلەو زەوالە چەشنی تۆ چەشنی هەمو دنیا ! .
وەکو بارانی هاوین زوو فەنایە عومری بێ مروەت ،
تەبەخر مایەیە ، هەیهات ! هەچەشنی شەونمی سەرگیا . .

---

( ١ ) بنەڕەتی بیری ئەم هەڵبەستە لە شیعری انگلیزی وەرگیراوە

# تازە

کە شەو هات و پەردەی ڕەشی کەوتە سەر ،
جوانی تەبیعەت ، کەژو دەشت و دەر ،
هەمو نوست ، هەمو مرد ، کش و بێ ئەسەر ! ۱
ســـەما تازە جیلوەی ستارەی نظر ! ؟

کە گولباخ ، نێرگس ، زەمەق ، یا سەمەن ،
هەمو نوقمی تەمی بـــەحری ئەم شەوەن ،
هیلاکی گروشمەن ، وەنەوزێك ئەدەن . .
ســـەما تازە جیلوەی ستارەی نظر ! ؟

کە گیا بۆ قەراغی چەمی پڕ لــە قاز ،
لەسەر ڕوی نـــەما زینەتی اهتزاز . .
لەســـەر لێوی لاچوو بزەی نووری ناز . .
ســـەما تازە جیلوەی ستارەی نظر ! ؟

کە دڵ کەوتە ناو دۆزەخی دەردەوە ،
کە عەشـــق و شـــەبابی خدا بردەوە ،
گڕی شـــاعریەت کەدامردەوە . .
ســـەما تازە جیلوەی ستارەی نظر ! ؟

# جەژنی نـــەوروز

بە سوورێکی تر ئەستێرەی ئینسانگر ،
قەومی کۆنی خسپتەوە جەژنی ئاگر . .

- کام قەومی کۆن ، کام جەژنی بەرزو پیرۆز ؟
قەومی مادی ، جەژنی بلندی نەورۆز ! .

ئەو نەورۆزەی کە هەزاران بەهارە ،
لە دێی کوردا گڕی ئاگری دیارە . .

باو باپیرمان هەتا ئەڕۆن پشتاو پشت ،
لەم ئاگرەیان دەورە داوە چین چین ، گشت ،

لە چواردەوری ئەم ئاگرە ڕەنگاو ڕەنگ ،
کۆڕ گیراوە بە پێکەنین و ئاهەنگ ،

بانگی شێوان هەتاکو بەر بەیانی ،
چۆپی بوە و بەزم و نۆش و گۆرانی ،

لەو سایەوە تا ئیستاکە بەم چەشنە ،
هەمو سەری سالی تازەمان جەژنە . .

میوانی کۆن بەرێ ئەخەین و تازە ،
بە پێکەنین ئەگاتە بەر دەروازە . .

خۆشیت هێناو فەرت هێناو شیرینی !
تۆ بۆ ئێمە بەهەشتی خەو بینینی ! . .

بەهاتنت بای بەستەڵەك ، بەفری دەشت ،
گیانی سپارد گوڵی ڕوا جێگای گەشت !

لە تاریکی لە چوار دیواری زستان ،
سەرفراز بیت ! سەرفراز بو مەلی گیان !

ئێستا تۆخەی ئاسمانێکەو هەتاوی ،
گیایە و گوڵە و مەلە و خوڕەی چەماوی ،

چی خۆشترە لەوەی تەبیعەت جوان بێ ؟
ماوەی سەرنج بانایی گشت ئاسمان بێ ؟

گیانی سەرمەست ، باڵداری ڕێی هیوا بێ ،
بەرزبێتەوە بە پەلەی هەور بدا دڕ ؟ .

بفڕێ بڕوا بۆ کوردستانی ئاوات ،

ماندوو نەبێ ' هەر بڕوات و هەر بڕوات ،

هەتا ئەگاتە لوتکەی شاخی سەربەست ،

بێ زنجیری گەل ئەبینێ و نەبێ مەست ! ؟



# دوا سەرنج

[ بۆ قژ زەردی بەردەرگا ، لەسەر ڕێی
بەندیخانەما لە موسڵەوە بۆ هەولێر ] .

ئەی قژ زەرد ! ئەی بەژن و باڵای کەڵەگەت !
بۆ کز ڕاوەستاوی بەرامبەری من ؟
بۆ دەستت ناوەتە ژێر چەنەی خەفەت ؟
لە عاستی دیمەنی دەربەدەری من ؟

* * *

ئەو چاوە کاڵانەت ، نیگای دەربەستبوون ،
لەبەرچی ئەگرنە گرفتاری‌ی من ؟
سەرنجت ڕووی دەمی پرس کردنی ڕوون ،
ئەکانە کەلەپچەی دەستی دیاری من ؟؟

* * *

ئەبینم پەپولەی نیازی گفتوگۆ ،
دوو دڵ ڕاوەستاوە لەسەر گوڵی لێو ؟
ئاخ خۆزگە هەڵئەفڕی ئەمزانی ئاخۆ ،
ڕاسپێری چی پێیە بۆ گیانی پەشێو ؟

* * *

ئەی قژ زەرد ! بەبەژنی ناو دەرگا گرتوت ،
هەروەکو پەیکەری شۆخی خەمخواری . .
مەلی بووم لە باغچەی هونەرا بێ جووت ،
بۆ جوانیم ڕێك ئەخست شیعری دڵداری . .

٭ ٭ ٭

بەڵام ئەهرەمەنی گەڵای باخ سیس کەر ،
بێزارە لە جووکەی دەنووکی کوردی ،
ڕاوکەری دارستان لە باڵدار پیس کەر . .
جێی چینەی لێ ئەنیم بە داوی وردی ،

٭ ٭ ٭

وا ئێستا ئەبینی گیرۆدەی داوم . .
لەبەردەم جوانێکی وەك تۆی دڵ نەرما ،
لەگەڵ [ گارد ] لە پاس دا ڕاوەستێنراوم ،
تا داخی گرانتر خول با لە سەرما . .

٭ ٭ ٭

ئەی قژ زەرد ئەی گەردن بەناز لارگرتوو ،
دیوێکم لە پاسا تۆی ، دیوێکم باخە !
ئەکەمە هەچ دیوێك نیگای ئارەزوو ،
بۆ گیانی قەفەسیم سەرچاوەی ئاخە ،

٭ ٭ ٭

بۆ لای باخ ئەڕوانم ! بەهار وەك پەری ،
فستانی گیاو گەڵای سەوزی پۆشیوە ،
زەردوو سوور گوڵباخی داوە لەسەری .
ئارەقی سەرکوڵمی دڵۆپی زیبوە . . !

ه ه ه

بۆ لای تۆ ئەڕوانم قژ زەردی نازدار !
ئەبینم دوو چاوی ناو ڕیزی برژانگ ،
پرشنگێك ئەگرنە نیگای گرفتار ،
ئەم دیوە لە گزەی بەر تریفەی مانگ ،

ه ه ه

پرشنگی نیگایەك کەلە ڕووی ڕووناك ،
هەڵئەستێ و تیژ ئەکشێ تا ناخی دەروون ،
کڵپەی نوێ ئەخاتە کوورەی عەشقی پاك ،
دەفڕێ ، گیان پڕ ئەکا لە خۆزگەی بەربوون . .

ه ه ه

بەڵام ئاخ دوو گاردی چاو لێم داپچڕاو ،
چەپ و ڕاست وەستاون بۆم ، دوژمنانە ،
کەلەپچەی لە دەستما توند کلیل دراو ،
نیشانەی ڕێگامە کە بۆ زیندانە . . .

ه ه ه

هەر ئەوەم لە دەست دێ هەتا ئەتوانم ،
تا لەم هەلوێستەدا هەل بەکار بێنم :
وەك تینوی چاو لە ئاو بە کوڵ بڕوانم ،
ئەو چاوەی تێم بڕبێت نەی تروکێنم !

٥ ٥ ٥

بۆ ئەوەی بتوانم لە پەردەی بیرم ،
نیگارێ هەڵ کەنم شێوەی لێت بچێ !
تا هەرچەند گازی گرت لە لەش زنجیرم ،
ئازارم سووکتر کا خەیاڵی کچێ :

٥ ٥ ٥

کە شۆخەو قژ زەردەو ، باڵا ڕێك و بەرز ،
خەمخواری نەناسە ، وەك فریشتەی ئەرز . .



# بەردە نووسیك

لەسەر كێلی گڵكۆی گەورەكچێك هەڵكەنراوە

لە خاكی گڵكۆما ئـەی گۆڕستان گەڕ !
ئـاخێك بنێـژە !
بە كێلی مەڕ مەڕما فرمێسكێكی تـەڕ !
لە چاو بڕێژە !

لە دنیای ڕوناكـتا منیش گیانێ بوم ،
لە لەشی جوانا !
وێنەی پـەپولەیەك ئـــەهاتم ئـــەچوم ،
لـەنـاو گوڵانا !

كۆشی گەرمی دایـك جێگای نازم بو ،
گیان بوم لای باوك !
ناوبانگی چاوڕەشی شـــنەی ڕازم بو ،
بو بو بەلاوك !

بەڵام ئاخ كەناڵـەی لاوكی لاوان ،
زوو مەستی كردم .

بەرێی عەشقی پاکا نام ملو . . تاوان ،
بۆ لارێی بردم !

لاوێکی نامەردم تووش هات ، لەرێما .
بەسوێن‌و پەیمان ،
وەك ڕەشمار پەپکەی خوارد نوست لەناو جێما
ئابڕومی تکان !

پاش ئەوەی ماری پیس ژەهری خۆی ڕژان
کشایەوە کون ،
هۆی شەرمی لە باوکم کرد بەمایەی ژان
کەتن کەری وون ،

ڕووی نیازی زەردی دایك و باوك و خۆم
بێ‌سوود کەوتەگەڕ ،
خوێش چەشنی باوکی ، تفی هەڵدا بۆم ،
گوێی‌لێ کردین کەڕ

ئەو کوڕ بو سەرەڕای ئەمەش دەست دار بو
بەدەستووری گەل ،
ناپاکی کردەوەی ، دوور لە پرســیار بو
بەلام ئاخ ئەجەل !

منی کچ ، ماەزی بەندیخانەی ژین ،
سزای تاوانم ،
بەدەستی باوکی خۆم چووم بەسەر برین ،
برچی پەخشانم ،

تلا لە خوێناوو کەوتە سەرچاوم ،
ئیتر نەم بینی :
لە جەرگی باوکما سەری بڕاوم ،
چۆن بوو برینی ؟ .

یان دایکی دڵسۆزم وێرای بەبێ شەرم ،
بۆ جوانە مەرگی ،
وەك دایکان شیوەنێك بگێڕێ بەهەگەرم ،
ڕەش کا بۆی بەرگی ؟



# لــــه بەندیخانە

تاوانم کرد ، گەل پێوەی نام مۆری ناپاکی
بۆ زیندانە کۆچی ژینم ،، دنیای ڕووناکی !

وتم : گەل نەء ! گەل فرۆشی دەزگاو دوکان گێڕ ،
عاری تێرپۆش ، خەوشی برسی موبەمو زمێر (١)

دزی تێرو بێ‌پێویستی نارده سەر برسی ،
وتیان دزەو پرسیارێکی زۆریان لێ پرسی ..

کابرای برسی بێ‌تاوانیش مل کەچو سەرشۆڕ ،
چۆنیان لێ‌ویست بۆی هەڵڕشتن وەڵامێکی زۆر ،

کار تەواوبو قۆچی دزی بوبە سندوق بڕ ،
مێشك ماندوو ، دڵ بریندار گوێ لە توانج بڕ ،

لوولەی تفەنگ لە برپرەی پشتی قایم بو ،
تەقەی پۆستاڵ بە شوێنیەوە هەر هاتو هەرچو ،

[ ١ ] خەوش : عەیب

ئەوا ئێستا باخچەی ژین و شیعرو خەیاڵی ،
بوبە ژوری بەندیخانەی تاریك و خاڵی !

* * *

ساخوات لەگەڵ ! دنیای جوانی ، دنیای رووناکی !
تاوانم کرد گەل پیوەی نام مۆری ناپاکی !

ئیتر من هیچ نەئادەمیم ، نە نیشتمانی ،
نەئەندامی ئەم کۆمەڵە ، نە کوردستانی . .

نا بۆ کوردێك کفرە ئێستا کوردستان وتن .
چەرچییەکانی ئیستعمارم لێ ئەبنە دوژمن ،

لە عیراق‌داو بەقانونو بێ‌رۆی عیراقی . .
کوردێك گیراو بەندو زنجیر خرایە لاقی ،

حەقی وەك کورد هەرنەبوەو هی وەك عیراقیش ،
بزر ئەکا لە بەندیشاو لە پاشی بەندیش . .

* * *

ئێستا من‌و خەلقی ئەم‌دیو ئەم چوار دیوارە . .
لە بابەتی جوێ شێلراوە هەستیمان ، دیارە :

ئەوان چەشنی فریشتەنو بێ‌گەردو پاکن ،

دنیا هەربۆ ئەوان خولقا ئـەوەندە چاکن ،

بۆیان هەیە بەپێی دڵخواز بخۆن بپۆشن . .
سەربەست بژین بـەختیاری پێك پێك بنۆشـن ،

گوێ‌بگرن تێر لە ئاوازەی مۆسیقای شیرین ،
کۆڕی بـەزمو ئاهەنگ بکەن پڕ لـە پێکەنین ،

بەناو جوانی تەبیعەتا بێنوو بچن مەســـت ،
بۆ کام میوەی زۆر سەرچڵە درێژ بکەن دەست ،

بـــەڵام منو وەك منەکانی بەندیخانــــە ،
دروست‌بوونمان لە قوڕێکە ئەهرەمەنانە ( ١ )

بۆ تاریکی ، بۆ شەرمو عار ، بۆ خەم خولقاوین ،
لە بەهەشتی ئەودیو دیوار بێ‌بەش کراوین ،

مانگ‌و ڕۆژو ئەستێرەی خوایش لەگەڵ دەشتودەر ،
قانون ئەڵێ : قەدەغەیە دەرحەق تاوانکەر !

٥ ٥ ٥

ئەی مانگ‌و ڕۆژ ، ئەستێرەی شەو ، هەڵمەیەن ئیتر !
بۆ ئـــەو دیوی بەنهێنی لە تاوانکەر بڕوڕ !

[ ١ ] ئەهرەمەن ـ شەیتان

بۆ ئەو دیوی بەئاشکرا فەضیلەت فرۆش !
لە پەناوە پاسکەری دز واعظی سەرخۆش !

بۆ ئەو دیوی شێخو مەلا بەشی زۆر جاسوس !
زۆربەی ئاغای بەپێست مەردو بەئێسك بێناموس !

بۆ زۆرداریی لای خۆدڕوو لەلای بێگانە ،
دەست لەسەرسنگ لەبەر ئەکەن جلی ژنانە !

بۆ ئەو دیوی کە زۆر پیاوی گەورەو ناوداری ،
گیانی چەورو چڵکنە وەك لەشی هەژاری !

بۆ ئەو دیوی پڕلە درۆ ، پڕ لە دەسیسە ،
بۆ ئەو دویوی کە هیچ نەبێ ، وەك ئەمدیو پیسە !

ە ە ە

ئەی تیشکی ڕۆژ ! ئەو وڵاتەی کۆمەڵی پاکە ،
ئەندامێکی وەك منی تیا ئازادو چاکە ،

ئەندامێکی وەك منی بۆ شیعرو ئەدەب زاو ،
تیا نابێتە پارە دزی برسی و ناتەواو !

دزی برسی ، یان تەماعکار ، دەوری فرمانی ،
ناگرن هەتا بەقور بکرن ماڵی وێرانی ! .

ئەو کۆمەڵەی خوا پێداوە ، خاوەن بەهرەی فەن .
بۆ پیانازین بەخێو ئەکات ، نەك ڕیسوایی‌و بەن !

بلبـــلێ بوم ئامادە بوم هەتا بمێنم . .
بەنانی ووشك بەرگی پەلاس بۆ گەل بخوێنم ،

بەلام گەلی بە شرینقە خەو لێ خراوم . .
گوێی نـــەدامێ هەتا کەوتم ، چلکن بو ناوم !

٥ ٥ ٥

ئەی تریفەی مانگی سپی دەرکی دەلاقە !
باپیس نەبیت ! خۆت مەدە لەم کوردی عراقە !

ولاتەکە داگیر کراو نەتەوە دیلە . .
باو لای دوژمن نامەردیەتی ، مەردی زەلیلە !

کای لەبەر سەگ دانراوە ، ئێسقان بو ئەسپە ،
سەر لەجێی کلك بەند کراوە کلك لەسەر چەسپە !

شێوێنراوە بەدەستی قەست شـــیرازەی کاری ،
تا ئاسان بێ بۆ سورفلی چەرچ ئیستعماری . .

وەك بزنـــو دەمبێتە جواناوی نـەوتی ،
لێی دەرهێنێ دوا دەنك‌و فلسی دەسکەوتی !

ئەی مانگی بەرز ! سا هانابێ مل بنێ بۆ دوور !
بۆ ولاتێك جێی نیزام بێو سەربەست بێو ڕوسور !

بۆ ولاتێك هاونیشتیمان تیایا ئازاد بێ ،
ژیری دلسۆز باوك بێتو گەلیش ئەولاد بێ ،

هەر ئەندامە بەپێی بەهرەو لێ هاتنی خۆی ،
ماوەو جێگای فرمان کردن ڕێك خرابێ بۆی ،

ئیش بکاتو نان بخواتو بەرگی خۆی بدڕی ،
بەبێ ئەوەی ناچار ببێ ڕێی تاوان بگرێ .

ئالەو خاکە پرشنگ ڕێژی پرچی زێرینت !
ئەی مانگی جوان ! سەنگین ئەکا نرخی بینینت !

ه ه ه

ئەی ئەستێرە ! ئەستێرەکان ، بەرزو گەشو دوور !
ئەگەرچی من ناتان بینم ، لەبەر سەقفی ژوور !

بەلام دیارە ئێستا جوان ، جوان چاو ئەتروکێنن ،
ڕوی ئاسمانی شینی ژوورسەر پێ ئەکەنێنن !

ئاخ نازانن خاوەن چێژان فرمێسکی چاویان ،
ڕێگا نادا بڕوانە زینەتی ئاسمان . .

لەم وولاتەی کە رووی خاکی گوڵ گوڵی داخە ،
بریق جەرگ لە باغچەیا لەجێی گوڵباخە ،

خواتان لەگەڵ ئێوەش برۆن لێرە ئاوا بن ،
بانەکەون وەك من کەوتم ئەستێرەی چا بن !

٭ ٭ ٭

ئەی دنیای جوان ! دنیای بەهار ! دنیای رووناکی !
تاوانم کرد گەل پێوەی نام مۆری ناپاکی !

فڕێی دامە پشتی دەرگای ئاسن و پۆلا ،
لە ژورێکی تەنگەلانی تاریکو چۆلا ،

لەگەڵ ئەوەی گیانم تیایە بە هەناسەو نەبز ،
ئەڵێی مردوم خراومەتە ژێر ئەلحەدی قەبز . .

بەقەد کونی دەلاقەکەم ئاسمان دیارە :
ئەمە هەموو تاونیشانی رۆژی بەهارە ؟ . .

بۆ بەندییەك کە زیندانی دڵی خەمباری ،
دوا دەلاقەی گیراوە لە ژووری بەهاری ،

بۆ بەندییەك کە پەیوەندی لەگەڵ دنیای دەر ،
بەدەستی ( داد ) پچڕێنراوە هاوڕێو برادەر ،

لە کردەوەی ناشیرینی لێویان گەزیوە ،
لە هاوڕێی وبرادەری دەسیان سڕبوە ؛

بۆ بەندییەك کە هیچ نەبێ تا بەرەڵلا بێ ؛
بەپێی قانون کۆشـــێ منداڵ ، منداڵی نابێ ،

کوڕ خەرجی خۆی لێوەرناگرێ ، کۆشی نابینێ ،
کچی ساوا کێ چوزانێ هەتا بمێنێ ؟ . .



# کوردوستان

کوردوستان ! جێگامی ، جێی هەزار ساڵەم
پەروەردەی ئەم دۆڵو سەرلوتکەو یاڵەم !

هەناسەم تێربۆنی بای کوێستانتە ،
دوو لێوەم پاراوی بەفراوانتە !

سەرنجم ڕاهاتوی زیوی زەرکەفتە ،
بە زەردەی سەر بەفری ئێوارە وەختە !

گوێم فێرە بیستنی خوڕەی قەڵبەزە ،
لەو عاستەی ۆوور بەفرە ، داوێن گیای سەوزە ،

زمانم پشکوتوی قسەی جوانتە !
قسەی ناو گۆرانی شاخەکانتە !

هێ ناو چیرۆکی گوێ ئاگردانتە ،
هێ ناو لایەی منداڵانتە !

قولپێ با خوێنی ناو دەمارەکانم ،
بە زەبری عەشقی تۆ ئەیدا نەیزانم !

غەشقی تۆ ئەی دایکی خۆمو هاو خوێنم ،
هەر لە پشتی باوکا چوە هەوێنم !

ئەشچیتە هەوێنی کوڕو کوڕەزا !
تا تاقێ کورد مابێ لە چیای بەرزا !

o o o

کوردوستان ! ئەگەرچی دوورە دنیای تۆ ،
دۆڵ و دارستانی چۆڵ و تەنیای تۆ !

دووری لە شارستان ، لە ژینی تازە ،
لە شەوی ڕوناك و پڕ لە ئاوازە !

پڕ لە پێکەنینو پڕ لە نەنوستن !
پڕ لە سوڕانەوەو پڕ لە کۆڕ بەستن !

ئەگەرچی تۆ دووری لە ڕوژی شاران ،
رۆژی پڕ لە گەردوش ، هاتو چوو جولاَن !

رۆژی پڕ لە زانست ، پڕر لە فەنی جوان ،
کتێب و ڕۆژنامە ، هەیکەلو مەیدان ،

ڕۆژی پڕ لە خۆراك بۆ گیانو بۆ لەش ،
رۆژی پڕ لە ئافرەت ، پڕ لە باغچەی گەش ،

ئەگەرچی تۆ دووری لەم گشت جوانی‌یە !
جوانیەکی تر هەیە کوردوستانی‌یە !

جوانی‌یەك کە دەستی هونەری یەزدان ،
نەخشی کێشاوە نەك سەلیقەی فەنان !

جوانیەك کۆن نابێ هەرگیزاو هەرگیز ،
زستان و بەهار و هاوین و پاییز . .

جوانی شاخی سپەختو دۆڵی قوڵو مەنگ ،
ملەی بەرز ، پلەی خز ، دەربەندانی تەنگ ،

مێرگی سەوز ، چەمی خوڕ ، داستانی چڕ ،
دێی بناری دەشـــتی پەنا گردی خڕ ،

دەعبای ناو ئەشکەوتوو ماسی‌ی گۆمی شین ،
باڵداری ڕەنگاو ڕەنگ پەپولەی نەخشین . .

* * *

بەڵێ ئەگەر بێتو رۆژێ لە رۆژان ،
لە کۆشتا لێك بدەن جوانی‌ی هەردوکیان !

ئەو حەلە سەرانســەر ئەبێتە بەهەشت ،
لە لوتکەی شاختەوە تا پانایی دەشـــت !

کوردوستان ، کوردوستان ، کوردوستانی جوان !
درەنگیش بێتە دی ئاواتی ( گۆران ) ،

دەربەستە نیم سێبەری پیرەدار بەرووم ،
ئەو تاوەی ئەشکێنێ تاسەو ئارەزووم . .

کەماویە ڕۆژی زەرد بگاتە دەم گەل ،
لای ژووروی سەرتەوە ئەجریوێنن مەل !

پۆلی ژن زەردو سوور ئەکشێ بۆ ناو ڕان ،
شوان ئەڵێ بەشمشاڵ : هەوری لار ئامان !

بەلام ئەگەر بێتو بە دوو چاوی خۆم ،
بتوانم ببینم بەری هیوای تۆم !

ئەو حەلە کوردوستان : کوردوستانی جوان !
هەڵپەڕین لە من و بەستە لە ژیان . .



# بو هیوای کورِم

هیوا مەگری ! هەنسکی نیوەشەو بەس هەڵدە بەس بگری !
لە چاوی بێ قەرارم بۆچی دەرمانی وەنەوز ئەبری ؟

کوری خۆم ! کورپەلەم ! میوانی دنیای تازە خوڵقاوم !
ئەدا گریەت بە زەربەی چز لە ڕۆحی پڕ گلاراوم !

چیە ئەم گریە بێغایە ؟ کرۆزەی نیوەشەو خورپێن ؟
چیە ئەم قەترە وردانەی لە چاوت بێ مەئال ئەرژێن ؟

لەگەڵ ئەو خونچە ساوایەی لەسەر خەلقی بەهار ئەڕوێ ،
چیە فەرقت ؟ لەبەرچی ئەو هەتاکو سیس ئەبێ ئەنوێ ؟

وەکو ئەو بەرخە بچکۆلەی کەهەر ئێستا لە دایك بوو ،
لەبەرچی نەشئەیی یاری هەڵت نادانە سەر پاشوو ؟ ؟

ئەڵێی ئەو زەرنەقوتەی پەپکە مارە فەرش هێلانەی ،
چی ئێشێکە ؟ کورم بۆچی لەسەر ئەم هەڵکوڕۆزانەی ؟

چیە تو خوا چی سڕێکە وەها مەحکومی گریانی ؟
کەتۆ هێشتا لە خەم ناگەی ؟ لە مەعنای گریە نازانی ؟ ؟

ئەگەر وەك باوکە حەسرەت دیدەکەت زەهرت بچێژایە ،
زەمان گەردی ئەمەلی گشت بە دەم باوە بێژایە !

لەناو کلپەو بلێسەی نائومێدیو حەسرەتا یەکسەر ،
بسوتایە بەهاری عومری جوانیت ، هەم گوڵ و هەم بەر ،

بەڵێ رۆڵەم ئەگەر وەك من کەمێ بەدبەختی ئیدراکیش ،
لە تۆیشی رەش بکردایە نەوەك شەو رۆژی روناکیش !

حەقمە بۆ عەرش بلەرزێنی بە ناڵەی رۆحی پڕ ئێشت !
لە ئەستێرەی سەما بپژێنی فرمێسکی دڵی رێشت !

حەقت بو ئەم هەمو گریانی نامەفهومو بێ مەعنا ،
زمانی بسط و تقریری شکاتت بێ لە دەست دنیا !

حەقت بو بێ وچان بگری بەسەر تاوانی باوکیما !
بەحر پڕکەی لە تف بیدەی بە ناوچەوانی باوکیما !

بەلام رۆڵەم ، کە تۆ ئێستا لە فەجری زندەگانی تای ،
لەبەر دەرگای تەلیسمی بەختی مەجهولو نیهانی تای !

بەچی معلوم بە شوێنی هی منا برژێ چەمی عومرت ؟
سەرانسەر پێکەنینو خورەمی نابێ چەمی عومرت ؟

بەڵێ بەرخم ! ئەگەرچی هەروەکو یەك ژینی گشت لایە ،
لە بەینی بێشکە وە قەبرا بڕینی عەبنی ڕێگایە !

هەمو هەر قافلەی بێ اختیاری سەر زەمینێکین !
هەمو دێین و دڕۆین ، تاکو ئەگەین ، یەعنی ئیتر ئەمرین !

وەلێ کۆچی ژیان کۆچێکی پڕ سحرو پڕ ئەفسوونە :
لە یەك سەرچاوە دوو قەترە ا یەکێ لێڵە ، یەکێ ڕوونە !

هەیە وەك من بەسەر دڕکا ئەنێ هەنگاوی ئاوارە ،
هەیە هی وایش کە فەرشی ژێری پێی ئاوریشمی گوڵزارە !

ئەوەندەی ڕۆحی مأیوس و مەلول تاریك ئەکا دنیا ،
ئەوەندەش نور لە ڕۆحی شادەوە ئەڕژێ بەسەر سەریا !

کوڕم ! هەروەك لە أعجوبەی ژیانا بەختی بەد ئەگری !
شتێکیش بەختیاری ، پێکەنین ، گرتویە چوار دەوری !

بە خۆڕایی مەترسە ! خەم مەخۆ ! مەگری لە ئێستاوە !
بەچی مەعلوم کەچی لەو تەختی ناوچاوانە نوسراوە ؟ ؟

# یار

یار ! یار ! شیرین لەنجەولار !
یار ! یار ! ناسکۆڵەی نازدار !

چاوم ڕوا ، سەبرم سوا ، هێزم لێبڕا ،
هەر نەهاتی ، دەرنەکەوتی ، بۆچی توخوا ؟

٭ ٭ ٭

ژماردم گشت ئەستێرەی شەو ،
تاق تاق کەرەم کردە خەو ،

لەبەر کزەی بای سارد تەزیم ،
لەگەڵ گەڵای درەخت لەرزیم ،

ڕەنگ وەك گیا ، تەڕی کردم
هەر نەهاتی ، ئەوا مردم !

٭ ٭ ٭

یار ! یار ! شیرین لەنجەو لار !
یار ! یار ! ناسکۆڵەی نازدار !

چاوەروانم ، پەرێشانم ، پەرۆشە گیانم ،
سابمگەرێ ! سابمگەرێ ! هێزی ژیانم !

٥ ٥ ٥

نیگارم تینوی تەماشاتە !
دادو ڕەوەی سەر ڕێگاتە !

گوێم عەزرەتی سربەی پێتە
هەمیشە چاوم لە ڕێتە

دڵم پڕ تاسەو پەرۆشە :
دۆزەخێکە والە جۆشە !

٥ ٥ ٥

یار ! یار ! دەرمانی ئازار !
یار ! یار ! شۆخی عیشوە دار !



# گیان

نازانم تۆ چیت ئەی گیان ؟
یاری نازداری ژیان ؟

هێزی لەش جوڵاندنم ،
هۆی گەرمو سارد چەشتنم ،

تیفی دڵەی پڕ جۆشم ،
بزوێنی بیر و هۆشم ،

هاوڕێی هەمیشەی عومرم ،
لەو ساوە بووم تا ئەمرم ،

نازانم تۆ چیت ؟ من چیم ؟
تۆ من نیت ؟ یا من تۆ نیم ؟

تۆ دنیامی ؟ یا دنیام ؟
تۆی تیا هاتویتە ئەنجام ؟

تۆو ژیان کامتان کامن ؟
کامتان نەوتی چرامن ؟ ؟

یاخود پرشـــنگ کامتانن ؟
یا هەردو هەردوکتانن ؟ ؟

نازانم و حەیـــرانم :
ئـەی تـەلیسـمی ژیـانم !

هەر ئەوەنـــدەم لێ ڕوونـــە ،
ئەنجام لـە یەك جوێ بوونە . .

ڕۆژێك ، سبەی ، دوو سبەی ،
عایەن نیە ، چۆن ؟ یا کەی ؟

تۆ ون ئەبێ ، لەش ئەمرێ . .
لەش بـە یادگـار قەبرێ ،

جێ دێـلێ تـا زەمانێ
بەلاّم ئەی گیان ! تۆ کوانێ ؟

بـەلـــکەی مانو نـەمانت ؟
قەبرت ؟ یا ناونیشـانت ؟

# ئەی نەی !

ئەی نەی چیە وا بە سۆزو سازی ؟
بۆچ تۆش وەکو ئێمە عەشقبازی ؟
یا مەحرەمی ڕازی عاشقانی ؟
بۆ ئاهی دەروونی تەرجومانی ؟

لەبریزە دڵی زەعیفو زارم ،
لەو عەشقە مەئالی اضطرابە ،
لەو نایە کە پێوە بێ قەرارم ،
لەو سەمە کە مهلکی شەبابە . .

ئامالی عزیزی نەوجوانیم ،
پامالی مظالمی زەمانە ،
هەر سانیەیەك لە زیندەگانیم ،
عەمرێکی هەمو خەمی جیهانە .

ئەی نەی ! دەبە نەغمەی خرۆشان ،
ئەم ناوە بەجارێ پڕ سەدا کە !
بۆ ڕۆحی شکستە باڵی تالان ،
لاوانەوەیەك بە کوڵ ئەدا کە !

# گوران [1]

گۆڕاوم بەڵێ ئەبێ بۆی لێ ئێم ،
کە من گۆڕاوم !
عەشقت وەك جاران تأسیر ناکا تێم ،
ئەی نوری چاوم !

° ° °

لەگەڵ ئەوەش دا هێشتا هەر یاری ،
چەرخی بێ پشو .
بەبای نەداوە یاری دڵداری ،
ئەو ڕوژانەی زوو .

° ° °

[ ١ ] لە هاوینی ساڵی ١٩٣٣ دا لەسەر ویستنی حامد فرج بۆ ئەوەی لە ( دیاری لاوان ) ی ٩٣٤ دا بلاوبکرێتەوە لە انکلیزیەوە کردم بە کوردی بەهۆی بەراوردی نصی انکلیزیو عەرەبی‌یەکەوە لە مجلەیەکی میسردا لەپاشا هەڵبەستەکەی خۆمم لەگەڵ تەرجومە عەرەبیەکە نارد بۆ ( بێکەس ) ی رەحمەتی کە ئەو حەلە لە ( بازیان ) مامۆستای قوتابخانە بو ئەویش هەڵبەستێکی لەسەر دانا .

( گۆران )

بەڵام ئارەزووو ئاواتی جاران ،
ئەوژمو مەستی نادا بە ژیان ،
چەشنی شیرین خەو ،
نوستوی بەجێ هێشت بۆ تاریکی شەو ،
ئەگەرچی ئێستاش ،
چۆن ڕۆیشت ون بو ، هیچ نازانم باش ،

٭ ٭ ٭

بۆچ تێم ئەڕوانی خۆشەویستەکەم ؟
وەك ئەو شتانە ،
کە کەوتونە ژێر شینایی ئاسمان ،
مل کەچ وەستاون بەرامبەر گۆڕان ،
باڵداران ، گوڵان ، گەڵای درەختان ،
ئەو ئەستێرانە ،
کە ئەجریوێنن بەرزو گەشو جوان ،
ئەم گشت هەردانە ،
دەریا گەورەکان ، هەموشت ، کەم ، زۆر ،
ئەگۆڕێن لەگەڵ چەرخی دایم گۆڕ . .

٭ ٭ ٭

گیانە ، ئاوێنەش پیشانمان نادا ،
ئیمرۆ ، بەیانی ،

ڕوی خۆمان ، لەیەك شێوەو وێنەدا ،
ئـــەبێ بـزانی ،

* * *

هەرچیمان هەیە ، ئارەزو ، ئاوات ،
تاسـەو ، خەوبینین ،
هیوا ، ترس ، هەمو ، هەمو پێی‌ئەگات ،
دەستوری گوڕین .

* * *

پێم بڵێ ، ئاخر چلۆن ئەتوانین ،
وڕك بگرین لە دڵ ؟
کە قنیات بکات بە یادی دێرین ؟
نابینی پێش گوڵ ،
چەند خۆشەویستە وەنەوشەی مل لار ،
لای دنیای بەهار ؟

* * *

ژنیش داخەکەم ! لەم خۆش ویستنە ،
هەڵناگرێ زیاتر . .
کە لێو لێك ئەنێ پاش زەردە خەنـە ،
بێ دەنگ ، ساردو سڕ ،

* * *

ئاخ ! منیش عەشقم ڕوو لە گوزرانە ،
لـــەگەڵ زەمانـە ،
منیش وەنەوشەم نەژاکێ ، ئەمرێ ،
تا گوڵ بەر نەگرێ . .



# ئاوینەی هەستیم

هەر ذرەیەك لە خوێنی دەماری پڕ ئاگرم ،
هەرچی حجیرەكانی هەیە كوورەی دڵم ،
شیوعی عشقو جازبەیە بۆ جوانی ، یا قەڵەم ،
قابل نیە فراغتم ، حەتا كە بیشمرم ! ..

ئەم دی دەمێ لە وەختی تفكرو مشغلەم ،
لێی تێك ئەدا خەیاڵی حوسنی رابطەو قەرار ،
بیرم ئەچو لە گەرمە خەوا ذكرو فكری یار ..
هەر عەشقی بێ بڕانەوە بو عومری كورت و كەم ،

هەر چەند بێ جوانی ، بە عەكسی پەرستشم ،
هەر دوورە لێم ، لە هەیكەلی حوزنو قەلەندەربم ،
هەر سڵ ئەكاتو بێبەشی نازو نەوازشم ..
لكن چ باك ؟ راستیەكەی چ دەسەڵات ؟
مایەو مەداری تەسلیەیی عەشقی مەعنەویم ،
بوكی خەیاڵی شۆخمە سەرگەرمی إلتفات ..

# زەنگی زویری (۱)

ئەوا دیسان لە گۆشەی نا دیاری ،
دڵم هەستا زڕەی زەنگی فکاری (۲)

بە ئەسپایی ، بە بێ‌هێزی ، بە عاستەم ،
هەوای ڕۆحم ئەخاتە سەر لەرەی خەم !

بە ئەسپایی ، بەلەرزۆکی ، هەزاری ،
ئەناڵێنێ لـــە شوێنی نا دیاری !

زمانێك دێتەگۆ ، هەرچەن زڕەی دێ ،
کە تێر نابم لە گوێ گرتن بەدووگوێ ،

[ ۱ ] هەندێك جار لە قووڵایی دڵما ، هەستی پەستیەك ئەکەم لـە چەشنە مەستیەك ئەچێت ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندەم بیرو خەیاڵو لێکدانەوە لێ ئەورووژێنێ شەکەتم ئەکات ، کەچی ئەگەر سەردەمێکی نەختێك درێژ خۆمی لێ بشارمەوە گیانم وەکو مناڵ ئەکەوێتە بەیابیەکی بەکوڵ بۆی . ویستم ئەم بیرانەم لە قاڵبی شیعردا دارێژم کە هەر چەند تێکۆشام هەر توانیم ئەمە بێنمە دی .

( گۆران ) .

[ ۲ ] فکاری : عاجزیو پەستی

زمانێك ، بەستەیەك ، دەنگێك ، نەوایەك ،
سكاڵایەك ، هەناسەو ئاخ و ئایـــەك ،

كە تێناگەم ! كە نازانم ئەڵێ چی ؟
بەڵام خوڕ خوڕ لەگەڵیا ڕۆحم ئەگری !

چیە ؟ ئەی ڕۆحی بێ لێوارو بێ پەی ؟
لە تۆ ناشارەزایی مــن ، هەتاكەی ؟

چیە ؟ ئەم دەنگە ، ئەم ئاوازە دوورە ؟
كەبێ هەڵهێنەری چاوی شعورە ؟ !

كەدێ ، پەستم ! كەنایە ، ئارەزوی دڵ ،
بەدویا وێڵ ئەبێ مەنزڵ بە مەنزڵ !

چیە ئـەم زەنگە زرنگەی دێ بەماتی ؟
كە ژێر تەم كەوتوە شوێنی وڵاتی ؟ !



# ئاخ ! هەزار ئاخ

ئۆف هەزار ئۆف ! ئاخ هەزار ئاخ ! تا قیامەت ئاخ‌و داخ ،
من کە سنگم بەردە ، طبعم بەرزە ؛ چەشنی شاخو داخ ! ..

من کە خوێنم ئاگرە ،
چونە جۆشم حازرە ،

من کە مایەی فەخری تأریخی بەرووم ،
تاقە رەنگی ئابڕوم ،

مەردی ، بێباکی ، دلێری بۆ هەمو ،
کوا ؟ مەگەر ئەسلی نەبو ؟

بۆ سەرم نەرمە لە عاستی بەندی دیلی ، داخەکەم ؟ !
بۆ لە نزمی‌و پەستیا وەك گۆمی لوطە شاخەکەم ؟ !

ئۆف هەزار ئۆف ! ئاخ هەزار ئاخ !
نەگبەتی کوردی هەزار ئاخ !

٭ ٭ ٭

بۆچی ئەو سنگەی سپەر بو بۆ پەلاماری عەدو ؟
بو بە پەردەی سەر قەفەس بۆ دەربڕینی ئارەزوو ؟

بۆ زبانی بیگرێم ؟
نایەڵێ سەربەست بڵێم ؟

ڕێبوارم سەربەخۆیی کەعبەمە :
دەشتی خوێن گەر ڕێگەمە ،

بێخطورەم ، بەردەبازم کەلەیە ،
تا ئەگەم بەو قیبلەیە !

بۆ نەهاتە ســەر دەمم ئەم چەشــنە گوفتارانە قەت ؟
بۆ نەبوومە پاڵەوانی کردەوەی تازانـە قەت ؟

ئۆف هەزار ئۆف ! ئاخ هەزار ئاخ !
غیرەتی کوردی هەزار ئاخ !

ە ە ە

ئەی ئەوەی قەومانی بەش بەش کرد بەپێی خاکو زمان !
دای بەهەر قەومێ نگینو تاجو تەختی حوڕ وڕیان !

کوا نگینی بەختی من ؟
کوانێ تاجو تەختی من ؟

بۆ لە خاکی پاک وزاری بیگرێم ،
قەدر ئەکەی نابەخشی پێم ؟!

یا ئیلاهی حقی خۆم داوا ئەکەم
کوا نگینو تەختەکەم ؟ ؟

بۆ لە عەرشی داد پەروەر بۆ دڵی کوردی هەژار
تاقە ئیریکی ستەم هەکس بکاتو بێتە خوار ؟

ئۆف هەزار ئۆف ، ئاخ هەزار ئاخ
خالقی کوردی هەژار ئاخ !



# دیاری‌ی خوای شـــەرر

دیـاری خوای شەڕ پەشمەو قینە ،
دوژمنی‌یەو ڕقە و کینە ،

بـــەدخوا هی یەو نیهـادی پیس ،
بـاری ایکدانـەوەی ئیبلیس ،

دیـاری خوای شەڕ بڕ بە دڵ ترس ،
یەکێ زمان و سەد هەزار پرس !

گومان لە ڕاست ، بەڵام باوەڕ ،
بەدرۆ ، ئاخ دیاری خوای شەڕ !

دیاری خوای شەڕ ڕەنجەو ئازار ،
مەرگی لەشکر ، وێرانی شـار ،

بۆ دایك : ئاقانە کوشتن !
بۆ کۆرپەی ناز : هەتیو خستن !

خوای شەڕ ئینسان لەهاو جنسی ،
ئـەکا بـە گورگێکی برسی ،

ئاگر ؛ قورقوشم ، غازی خنکێن ؛
ئەدانە دەستی و پڕ لە جوێن ،

ئەکا دەمی و پێی ئەڵێ : عەرش !
بۆین دەریای تاریکو ڕەش !!

بۆ ناو هەورو بروسکەی بەرز !
بۆجێی دوور ، دوور لەسەر ڕوی ئەرز !

عەرش وەك درندە ! وەك هارعەرش !
دنیا ڕەنگ کە بەخوێنی گەش !

بەلاماردە ! دەست و بردکە !
بگرە ! ببڕە ! بدڕە ! ووردکە !

قەڵا ؛ تەلبەن ؛ شورا ، سەنگەر ؛
حەیوان ؛ ئینسان ؛ شاریی ؛ عەسکەر ؛

ژن‌پیاو ؛ پیرجوان ؛ دەست قاچ ؛سنگ‌سەر؛
پێ شێلکە هەرچیت دێتە بەر !!

بێ‌سووچ بکوژە ! سەربەست دیل‌کە !
دەرگای مێشك و دەم کلیل‌کە !

کۆمەڵ برسی ، وولاٚت لات کە !
نەخۆشی زۆر ، دەرمان قات کە !

قوتابخـانـــە ، بیمارســـتـان ،
کۆگای فەن کردی کۆن و جوان ،

شۆینی بـەکەڵك گشت خاپوورکە ،
بنچینەو بان خواروو ژوورکە !

دەزگای شـارســتانی تێك دە !
ئەمڕۆ و ڕۆژی مەحشەر لێك دە !



# رۆڵەی بێ دایک

نە ئاخ لە سینەدا ئەخوانەوە پەنگ ،
نە فرمێسک ئەتوانێ بڕژێ بەبێ دەنگ ..

نە زمان ئەوەستێ لەمە زیاتر ،
نە قەڵەم وەك لاشەی مردوی ساردو سڕ ،

نەفام لە جێگای خۆی ئەمێنێ ، نەهۆش ،
دیمەنێ من بینیم بەرد دێنێتە جۆش !

کێ دایکێك ئەتوانێ بێنێتە بەر چاو ،
بە مەرگی تاقانەی جەرگی هەڵقرچاو ،

دامابێ لە دەشتێك هاواری بەکەس ،
نەگا هیچ ، هەر خۆی بێ و مەیتی کوڕی بەس !

ئا سەیری دیمەنی وەها کاریگەر ،
کام ویژدان ئاداتە بنەر نووکی نەشتەر ؟

بەڵام ئاخ ! ئەوەی من دیم بەم دوو چاوە ،
مەینەتیەکی سووکە ئەمەی بەلاوە ،

نەك دایكی كوڕ مردو ، دیم كۆرپەی ساوا ،
لای مەبێ دایكیا فرمێسك لە چاوا ،

كەوتبو بەبێ شیر ، بێ لاوانـــەوە ،
ناو جەرگی ئینسانی ئەچوزانـــەوە ؟ ! .



# نالـــەی بی کار

تا هێزی بزوتن لە لەشما بەگوڕ بو ،
من کوڕ بوم بۆ ئاغاو ئاغا باوکی کوڕ بو ، .
لە ماندوو نەبونی سەرئیشم واق وڕ بو ،
عەماری لە بەری تەقەلام پڕ پڕ بو . .

* * *

( نامەخوا ) و ( ئافەرین ) سەری لێ شێوانم ،
دڵسۆزی بۆ ئاغا ، ئەوەندەي ڕەتانم ،
تا رادەی ئەو پەڕی شەکەتی گەیاندم ،
پەکم کەوت نەخۆشی لەشی تێك شکاندم ،

* * *

نەخۆشی ناو جێ بوم ، بێ شۆربا ، بێ دەرمان ،
بۆ زمان تەڕ کردن ، نەختێك ئاو ، ئەم نالاَن .
بەرگوێم کەوت باوکی کوڕ ، نەك ئێستا هی جاران ،
قیڕاندی : بۆ نای بەن فڕێی دەن لە کۆلاَن ! ؟

* * *

ئەو دەستەی لە کۆلاَن گەیشتە فریای من ،
دەستێ بو بەتۆزو عارەقی ئیش کردن . .

زۆر دوور بو لەو دەستەی خاوێنە وەك هی ژن ،
پاروی چەور ئەگلێنێ ، بێ ڕەنجی نیش کردن

* * *

ئەو دەستە چلکنەی دوو لێوەی تەڕ کردم ،
دڵۆپی فرمێسکی کەوتە سەر ڕوی زەردم ،
بەقوتی دەمی خۆی ڕای گرتم ، نەمردم ،
ڕەنجبەر بو ، نۆکەر بو ، هاوپیشەم ، هاودەردم

* * *

تا ڕۆژی کەوتم گەیشتە شەش و حەوت ،
زوور سەری بەرنەدام هاو دەردی بێسرەوت . .
بەزەبری دڵسۆزی ئەوەندەم نزیك کەوت ،
پەتاکەم تووشی بو ، لەلاما ئەویش خەوت ،

* * *

وا ئێستا ئەو کەوتو ، من لەجێ هەڵساوم ،
کوناو کون ئەگێڕم لەشی تێك شکاوم ،
لە فەرمان ئەپرسێ زمانم ، گوێم ، چاوم ،
بۆ قوتی ڕۆژی خۆم ' هی هاورێی داماوم ؟

* * *

فەرمانێك قەی ناکا قورسیش بێ بەشانم !

لە ژێریا تێك دەرچێ گشت جومگەی ئێسقانم !
هەر تیابێ چەند فلسێك هیچ نەبێ بتوانم ،
نان بکڕم بۆ خۆمو بۆ هاوڕێی نیو گیانم !

° ° °

فەرمانێ ! ئەی کۆمەڵ ! فەرمانێ ! فەرمانێ !
بۆ دەردی بێکاری : چارەیەك ، دەمانێ !
زۆر شەرمە لە چەرخی بیستەما ئینسانێ ،
بێ ئیش بێو سکی خۆی هەڵ ووشی بۆ نانێ !

---

## لە کەرکووکەوە بو دایکم نوسیووە

ئەی دایە ! ئەگەر ئەپرسی حاڵم ،
( ئێ ! تۆیش وەکو باقی بێ ڕەحم نیت
تۆزقاڵێ ، کەمێ ڕەحم ئەزانیت ! )
ڕاستی شەوو ڕۆژ هەر دەناڵم . .

دەگریم و دەسووتێم هەروەکو مۆم ،
ئاهم ئەگاتە کۆشی گەردوون ،
مات و کزو مەلولو حەزوون ،
بۆ حاڵی غەریبی و بێکەسی خۆم !

کەرکووك ١٩٢١

# قالەمرد !

عاسمانی شینی ئەیلولی قۆ زەرد ،
نازانی تینوی فرمێسکە ڕووی هەرد ؟

نازانی کزەی هەناسەی بێ تین ،
چەن گەڵابەکی زەردی بۆ هانین ؟

بە ڕەنگی فرمێسک لێیان نوسرابو ،
قالە مرد ! هەی داخ ! باخ بەرەڵلا بو !

شاخونچەی خەڵقی تافی جوانی ،
بوبە داخی دڵ گەڵاڕێزانی !

عاسمان سابگری : بەبێ هیوابی !
فرمێسک برێژە تك تك ئەسپابی !

فرمێسکی تك تك ، لێکدانەوەی مەنگ ،
نیشانەی جۆشە بۆ دڵی زۆر تەنگ !

قالە مرد ! قالەی ئایشەخان و کورد !
قالە نا ، دایکی قالە مرد ، کورد مرد ؟ !

قالەی خوشکانی و قالەی خزمانی ،
ڕوناکی چاوی گشت سلێمانی !

کزەی بای مەرگی پێش وادە دای لێی ،
ئیتر ئێجگاری تاریك داهات جێی . .

تاقە تروسکەی وەجاخی بو ، ئاخ !
تاقە نەمامی ناو باخی بو ، ئاخ !

لە ناوەڕاستی شەقامی عومرا ،
ئایشەخان ، سامەرگ ! قالە ون کرا !

قالە تیری مەرگ پێش وادە پێکای !
ڕۆڵەی گەورەت مرد ئای ! ئایشەخان ئای .

نا ، نەمردوە تەنیا قالەی لەش ،
کەوتە ئەو دیوی پەردەی ئەو دیو ڕەش .

بەڵام قالەی گیان ، قالەی دروستی .
هەرگیز ون نابێ لە باغچەی هەستی ،

یادی گەورەیی و شیرینی و چاکی .
بەڵگەی مانە بۆ : ژیانی پاکی .

# ئەی لاوی کورد !

ئەی لاوی کورد ! کوڕی ئازا !
دانەنەوێنی بۆ قەزا !
بۆ زوڵمو زۆر ملی ڕەزا !
نەبە نیاز ، نەبە نزا !
نیشتمانت ڕزگار ئەبێ !
کۆمەڵت بەختیار ئەبێ !

هێز پێویستە بۆ حەق سەندن !
هێزی پێك هاتوی یەك گرتن !
هێزی باوەڕ ، هێزی ووتن !
هێزی کردن ، وڕەی دوژمن !
هەر هێز بنچینەی دەردێنێ !
قەڵای سەختی ئەلەرزێنێ !

ڕێگای ئامانج با سامدار بێ ،
با پڕ لە ترسو ئازار بێ ،
دڵسۆز ڕابەر ، هێز ڕێبوار بێ ،
کۆمەڵ یەك گیان ، یەك بڕیار بێ ،
کاروانی چۆن پێش ناکەوێ ؟

دوژمن لە بەریا نارەوێ ؟ ؟

ئەی لاوی کورد ! ئەی ڕۆڵەی ژیر !
ئـــەی نیشتمان دیلی زنجیر !
ئـــەی کۆمەڵ یەك چینی فەقیر !
نابێ هەرگیز دەرکەی لە بیر !
ئەو استعمـارە خوێن مژە .
کە کورد کوژە ، هەزار کوژە

ئـــەو ئەژدیها زار پژێنە ،
پاروو لەنـاو دەم فڕێنە ،
ڕەنجدەر لە برسـا مرێنە . .
وەك پلنگ شرکە ! بدڕێنە !
با کوردوستـان سەرفراز بێ ،
بەهەشتی نیعمەت و ناز بێ !

ئەی لاوی کورد پلنگی لان !
کوڕانە باز دەرە مەیدان !
حەق بسێنە بە ڕەنجی شان !
بۆ گشت هەژار بۆ گشت ئینسان !
لە کێ ؟ یەکەم لە استعمار
ئەمجا داگیرکەرو زۆردار !

# شــــەهید

بەیادی شەشي ایلول [ شەڕی بەردەرگی سەرا ]

هەزارو نۆصەدو سی بو ، شەشی ئەیلول کە ڕۆژ هەڵهات ،
فریوی ویستنی حەق کەوتە ناو شـاری ســلێمـانی . .
( هەڵۆبکێ ) ئـەو جوانەی پڕ دڵی بو بۆ وەتەن ئاوات . .
لــە پێش جەمعێکەوە تا بەرسەرا ڕۆی هەڵمەتی هانی ،

ه ه ه

لەگەڵ یارانی ئەیوت « ئەی حکومەت ! » تانەکەی تثبیت ،
حقوقی کوردەواری ، نایەوێ کورد ئینتخاباتت !
ئەوانەی بانگێ کران و تۆ بەقوەت دەوریان ئەگریت ا
دەنی و قازانج پەرستن ، هیچ نەبێ پێیان موبالاتت ،

ه ه ه

ئەوانە کەی لە میللەت بون هەتا تەمسیلی رأیي کەن ؟
حکومەت ئێمە کوردین وا ئەڵێین نامانەوێ نواب ا
کە داوێنی غەرەز بگرن بە هەردو دەست وەتەن بەردەن ،
نەکەی مشــروع نیە دەرکە لوسەر سەودایی ئینتخاب !

ه ه ه

ئــەمە جوملەی قســەو ئامالی یارانی هەڵۆ بگێ بو ،

نه نامشروعی تیابو ، نــــه تەجاوەز بو بە ئەمنیەت ،
کەچی عەســـکەر بە مەترالیۆزەوە بۆ قەتلی عام دەرچو ،
درایە بەر شـەقەی شـەست تیر ڕجاو ئامالی میللیەت !

* * *

شەقەی شەست تیرو ترچەی دەسـت ڕێژو هەلمەتی سونگی ،
بەخوێنی کوردی بێتاوان شەپۆلی خستە سەرجادە ،
نەما جوانێ کە سنگی نەی سمی بێ صەد کەرەت سونگی ،
نـــەما پـیرێ لـە ڕیزی گوللە بووبێ قەلبی ئازادە !

* * *

هەلۆ یەکێ گوللەی ئەوەڵ لە ڕانی دا دووەم دەستی ،
کە خۆیو قەومەکەی وا دی بەچەشنی شـــێر نرکانی ،
پەلاماری کەدا بۆ ظابطێ ، یەك زللە خپ خستی ،
دەمانچەی سەند لە دەستی و ئاگری دا ئاوەکو توانی !

* * *

بەڵام فیشەك نەما هەر ظابطو یەك دو نفر کەوتن ،
لەپاشا عەسکەریش دەستی ڕێژی لێکردو پەلادا هات ،
لەسەر دەریای خوێن بو کەشتی عومری بەرەو مردن ،
ئەچو ئەیوت : خوا حافظ ئەوا ئەمرم وەتەن هەیهات !

* * *

لەپاوەشتا پشوی عومرم نەدی ئاوێ بە ســـەربەستی ،

هەتا مردن زڕەی زنجـیری دیلی بوو لە گەردنما ،
ژیانم عارو زیللەت بو ، لـه ژێر پێلاوی دوژمنما ،
بەخوێن بێ‌و گڵ هەڵی لووشێ ، کەوابێ هەیکەلی هەستی ،

° ° °

خوا کەی بلبلی باخی سـەرا ، هەرچەندە پایزە ،
بەخوێنی خۆم گوڵت بۆ ئاو ئەدەم سـابۆم بلاوێنە ؛
لەگەڵ ئەو جوانە پاکانەی لـە دەورم مەیتیان ڕیزە ،
لە خوێنا وێنە شێواوبن ، بە دایکمان بناسێنە ،

° ° °

بلێ بەو بووکی تازەی یەك شەوەم گەر هاتە سەر نەعشم !
نەڵی خۆی بۆ وەتەن کوشت‌و لە ڕێی عەشقی منا نەژیا ،
وەزیفەم بو لە پێناوی وڵاتیکا سـەرم بەخشـم ،
کەتۆی پەروەردە کرد بۆ من لە داوێنی چیاو کەژیا ..

° ° °

ئەگەر خوای گەورە بەخشی پێت هەتیوێ پێی بلێ ڕۆڵـە :
لە من فرمێسکی ویست باوکت ! لە تۆش داوا ئەکا تۆڵە !

هەڵەبجە ـ ئەیلولی ٩٣٢

# ئەنجامی یاران

## ( ١ )

شوێن : سەرچاوەیەك ، لەبن سێبەری کۆمەڵە درەختێکا ، لە دێیەکی بنار شاخ . پلوسکێکی دارین لە کەلەبەرێکی بەرزەوە ئاوێکی زۆری لێ دێتە خوارەوە .

٭ ٭ ٭

برزو :

ئەی دایەی سەرکانی ژێر سوورەچنار !
دایەپیرەی نوورانی !
کوا فەڕی ئەم کانەی ئەم جێگایەی پار ؟
کوا شەوقی جارانی ؟

وەنەوش :

کوڕی خۆم ! ڕێواری جوانو هەرزەکار !
جیاوازی چیت دیوە ؟
لە کانی و پلوسکی ژێر سێبەری دار ،
کە زیخی مرواریو ئاوی وەك زیوە ؟ ؟

برزو :

دایە ! ئاو ئەو ئاوە ! جێگا ئەو جێیە !
هیچ نەگۆڕاوە ! . .
بەڵام سوورە گوڵێك هەیە لەم دێیە ،

مەنیجی ناوە .

نابینم وەکو پار لەبەر پلووسکا ،
ئاوبدا بە کولمی نەرمو ناسکا ؟ ؟

وەنەوش :

ئەی جوانی سەر ڕێگا زۆر هەنگی برسی ،
بەباڵ هات لە دوور ؛
لای دایە ئەم شوێنەو ئەم پرسەی پرسی ،
دەرحەق گولی سوور ،

پێم نالێی چی‌کارەی ؟ ڕۆڵەم چی کەسی ؟
سەرسەودای چی‌کەوتوی ( مەنیج ) ئەپرسی ؟

برزو :

دایە پار چەتە بوم ، چەتەی نیشتمان ،
لە شاخ هاتمە خوار ؛
لەسەر ئەم پلوسکە مەنیجی چاو جوان ،
تووشی بوم یەکەجار ،

بۆم ڕوانی بۆی ڕوانیم بەدو چاوی ڕەش ،
سەرکولمی ئاڵتر کرد ، زەردەخەنەی گەش ؛

وەنەوش لەبەر خۆیەوە :

« ڕوخۆشی و شەرم و ناز تێکەڵ نیشان دان ، »
هەر شیاوی خۆتە ، ئەی مەنیجی جوان !

برزۆ لەسەر گۆرانی خۆی ئەڕوا :

بە دڵە کوتێ وە کە چوومە پێشتر ،
داوای ئاوم کرد ،
بۆی ڕوانیم بە نیگای ڕیشەی دڵ کێشتر ،
دەستی بۆ جام برد ؛

بینم نا بە جامی ( ئەناهیتا ) وە ،
خوا ژنی نازداری کانی و سەرچاوە ،

ئاوم خوارد ، سەرنجم دا لەباسکی ڕوت ،
پوزی هەڵ کراو ؛
لەسەر وردە زیخی مرواری و زمڕوت ؛
وەك مەڕمەڕ تاشراو ،

ڕوانیمە باڵای ڕێك ، سەروێچی شل ،
ئەگریجەی وەك شەنوەی بەر بەفری لاملّ ،

٥ ٥

وەنەوش لەبەر خۆیەوە :

شیرینە سەرتاپای ئەندامی مەنیج ،
شیرین تر ڕەوشتوو خوو قامی مەنیج !

برزو لەسەر تەواو کردنی گۆرانی خۆی ئەڕوا :

بە قسەی لەرزۆکی لە گەروو گیراو ،
لە گەلی دوام ،
لاوانمی بەدەمو لەبزی وەك شەکراو ،
پرسیارو وەلام ،

گەیشتە ناونیشان ، ناو ، دۆست ، دەزگیران ،
تا دەستمان بۆ یەکتر نایە سەر قورعان ،

کە هەرگا پێویستی نیشتمانم دی ؛
لە چەك بەردرام ،
مالی زۆر هەلگرم بێمە خوازێنی ،
گولی خونچەی هیوام ؛

وا ئێستا چیم هەبو کردوومە بە ڕەخت ،
وەك عەودالی کەوتومە شوێن تروسکەی بەخت !

وەنەوش :

ئەی ڕۆڵەی لاوچاکم چەشەی نیشتمان !
داخی گـرانم !
زمانم ناچەرخێ بـە قسـەی ڕەوان ،
ئـەوەی ئـەیزانم ؛

لـە بـارەی مەنیجو ئـەستێرەی بەختی :
بۆ توی بگێڕمەوە بە ساردی و سەختی !!

برزو :
هەی داپیر ! دەخیلم ، ! چیە خەبەرت ؟
ئـارامت بـردم !

وەنەوش :
ڕۆڵەکەم ! کەڵکەڵەی مەنیج لـە سـەرت ،
دەربکە !

برزو :
. . . . مردم !
بێگومان ؛ مەنیجی نازدار مردوە !

وەنەوش :
نە ماوە ، چی ماێ ؟ مێردی کردوە !

بۆ ماڵ و ژن بەژن باوکی چروکی ،
لە دێیەکی دوور ،
لە بەندی پیرێکی توند کرد بەبووکی ؛
ژاکا گوڵی سوور !

وا ئێستا کەوتوە لەسەر نوێنی خەم ،
فرمێسک ئەبارێنێ ؛ کەی کەم ئێستەکەم !

٭ ٭ ٭

## ( ٢ )

لە هەمان جێگا لەپاش هەفتەیەك لەسەر گلکۆی برزو ؛

کۆرسی کوڕان :

لێرەدا دڵدارێك ئەنوێ کشوومات !
نەوجوانێك بو ،
نەریێ بەد نەی هێشت بگا بە ئاوات ،
یاری لە کیس چو !

یەکەم جار لێرەدا بەستبوی پەیمان ،
هەر لێرەش خۆی پێ کوشت دەردی بێ دەرمان !

لەسەر گڵکۆی تەنیشتی ئەو :

کۆرسی کچان :

ئەمەیە قیبلەگای نەوانی کچان !

گڵکۆی مەنیج جوان !

بۆ دۆستی جوانە مەرگ وەفای خۆی نوان ،

ئەویش خۆی خنکان !

خۆی کردە قوچی عەشق ! قوچی سەربەستی !

بچڕانی زنجیری کۆنە پەرستی !

لە هەمان جێگا هەردو کۆرس بەتێکەڵ :

بێن کچان ! بێن کوڕان ! پەیمان بەستین !

بۆ هێزی زۆرداری مل کەچ نەوەستین !

شەیدانی عەشق ،

بکەین بە سەرمەشق !

دڵداری ڕاست و پاك ئامانجمان بێ گشت !

یان بژین سەرفراز ! یا بچین بەکوشت .

ہ ہ ہ

خوێنەواری بەڕێز :

هاوکاری بکە لە کۆکردنەوەو بڵاوکردنەوەی هەڵبەستو نوسینی گەورەترین ئەدیبی میللەتی کوردا ( گۆران ) . وە چیت لەلایە لەمانەی کەلەخوارەوە باس کراون ، بی‌نێرە بۆ هۆگر گۆران لە دائیرەی ئیسلاحی زراعی لە سلێمانی .

١ ـ پەیامی کورد بۆ میهرەجان و شیعری ( بەفر ) وە ( ڕەشەبا ) .

٢ ـ تەرجومەی شیعری خیامو مەولەوی بۆ کوردی .

٣ ـ هەمو جۆرە وتارو پەخشانێکی کۆنو تازە .

٭ ٭ ٭

لەسەر ئەرکی هۆگر گۆران لە چاپ درا

چاوەڕوانی زنجیرەی ژمارە [٤] بن !

---

چاپکردنی تەواو بو لە چاپخانەی کامەران ڕۆژی ١٩٦٨/٥/٦

# گوران له چەند دێرێك دا



ـ سالی ١٩٠٤ له هەڵەبجه لەدایك بوه .

ـ هەر بەمنالی لای باوکی ( سلێمان بەگ ی کاتب فارسی ) دەرسی خوێندوه تا چوەتە قوتابخانەی سەرەتایی ، دوای ئەوە بۆ خوێندن چۆنه کرکوك وه دووسالێش له قوتابخانەی ناوەندی ئەوێ خوێندویەتی .

ـ بەهۆی مردنی باوکیو کوشتنی ( محمد بگ ) ی برایەوە خوێندنی پێ تەواو نەکراو گەڕایەوە بۆ هەڵەبجه وه کرا به مامۆستای قوتابخانه .

ـ که شەڕی جیهانی دوەم دەستی پێکرد کرا به مدیری بەشی کوردی له ئێستگەی ( شرق الادنی ) لەشاری ( یافا ) .

ـ که شەڕ دوایی هات گەڕایەوە ، وەله سالەکانی ٩٥٠ ـ ٩٥٨ دا تووشی ئازارو سزای دڕندانەی حکومەت بو .

ـ دوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ کرا به مامۆستای ( محاضر ) له دانیشگای بەغدا .

ـ سالی ١٩٦٢ به نەخۆشی سەرەتان کۆچی دوایی کرد .

نرخی

[ ٢٥٠ ] فلسه